

ئەیاد فەهمی

# لەبارەی یوسف(عليه السلام) بۆتان دەدوێم

ناوی کتێب: لەبارەی یوسف(﵇) بۆتان دەدوێم

ناوی نووسەر: ئەیاد فەهمی

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢١

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦٤٥)ـی ساڵی (٢٠٢١)ـی پێ دراوە.



RENWEN

**ناوەندی ڕێنوێن**

07511408868 -07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# پێڕست

# پێشەکیی

سوپاس بۆ خودا، کە دووبارە یارمەتی دام دەست بکەم بە ئامادەکردنی کتێبێکی نوێ، دەمێک نییە لە بەرگی دووەمی «لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم» تەواوبووم، بە خەیاڵمدا هات، بۆچی لەبارەی پەیامبەرانیشەوە نەدوێم، دواتر خەیاڵم بۆ چیرۆکی یوسف(عليه السلام) چوو، باشترین سەرگوزەشتە، ئەو چیرۆکەی دڵنەوایی پێغەمبەری خودای(ﷺ) پێکرا لە ساڵی خەمباریدا، ئەو چیرۆکەی بە تەواوی لە سەرگوزشتەی خۆشەویستمان دەچێت، ناوی خودام لێ هێنا و بوو بەم کتێبەی بەردەستت. پشتیوان بە خودا لەبارەی پەیامبەرانی تریشەوە بۆتان دەدوێم و دەبێتە زنجیرە کتێبێکی پڕ سوود و بەها...

گەڕاوم بەدوای جوانترین ڕامانەکاندا، ئەوانەم هەڵگۆزیوە کە باشترین کاریگەری دەخەنە سەر ژیانت و ئومێد و هیوا و گەشبینیت بۆ دەگەڕێننەوە، وەک وتراوە: هەر کەسێک خەمبار بێت و چیرۆکی یوسف(عليه السلام) بخوێنێتەوە، ئەوا خەمبارییەکەی نامێنێت. هەربۆیە لە وردەکاریی و چۆنیەتی چیرۆک و سەربووردەی یوسف(عليه السلام) ڕۆنەچووم، بەڵکوو ئەو ڕامان و وتانەم هێناوە کە دیوێکی تری چیرۆکەکە دەردەخەن، چاودێری و یارمەتی و پشتیوانی خودا دەردەخەن بۆ یوسف(عليه السلام) و وزە و هیوا لە تۆدا دەئافرێنن، هەوڵمداوە باشترین و کورتترین و پڕماناترین وتە دابنێم، بۆ ئەوەی هەم خوێندنەوەیەکی بەچێژبێت بۆت، هەم کتێبەکە گۆڕانکاریت

تێدا بخولْقێنێت، ئەوەندە دەڵێم: چیرۆکێک دڵنەوایی پێغەمبەری خودای(ﷺ) پێ کرابێت، خاترجەمبە دڵنەوایی تۆیش دەکات.

تەنها ئەم پێشەکییە هیی منە، ئەوانی تر لە کتێب و سەرچاوە و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە وەرمگرتوون، سوودی زۆرم لە ماڵپەڕی حەصاد وەرگرتووە، بۆ شێوازی کتێبەکە سوودم لە کتێبی (یوسفیات)ی عەلی جابر فەیفی و کتێبی (إني لأجد ريح يوسف)ی خالید ئەبوو شادی وەرگرتووە. وەک چۆن سوودم لە وتەکانیشی وەرگرتووە.

ئەیاد فەهمی سەنگاوی

١٥ی حوزەیرانی، ٢٠٢١

٥ی زولقەعدەی، ١٤٤٢



## وێستگەی یەکەم

# باشترین چیرۆک

چیرۆکێک دڵنەوایی پێغەمبەری خودای(ﷺ) پێ کرابێت، خاترجەمبە دڵنەوایی تۆیش دەکات.

﴿نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ
وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ٣﴾

واتە: ئێمە جوانترین چیرۆك و بەسەرهات بۆ تۆ دەگێڕینەوە، لەڕێگای ئەم قورئانەوە نیگامان کردووە بۆت، هەرچەندە لە پێشدا ئاگات هەر لێی نەبووە.

چیرۆکی یوسف(عليه السلام) ناونراوە بە باشترین چیرۆک،
چونکە تاکە سوورەتە بە خەون دەست پێ دەکات و
بە بەدیهاتنی خەونەکە کۆتایی دێت.
وەک ئەوەی خودا پێمان بڵێت:
دەست لە خەونەکانتان هەڵمەگرن.
فێرمان دەکات،
نەخۆش چاک دەبێتەوە،
ڕۆشتوو دەگەڕێتەوە،
خەمبار دڵخۆش دەبێت و
ناڕەحەتی و چەڵەمەیش هەڵدەگیرێت!
خاوەن ئامانجیش، دەگات بە ئامانجەکەی.

هەموو چیرۆکێک گەر جارێک گوێت لێبوو،
ئەوا لە جاری دووەمدا لێی بێزاردەبیـت،
تەنها چیرۆکەکانی قورئان نەبـێت،
ئەوا زیاد لە ١٤٠٠ساڵە دەخوێنرێنەوە و چێژی زیاتریان دەبێت!

﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ٤﴾

واتە: وەختێ یوسف(عليه السلام) بە باوکی وت: بابە گیان بەڕاستی من لە خەومدا بینیم یازدە ئەستێرە و خۆر و مانگ، سوژدەیان بۆ دەبردم.

لە نێوان خۆت و منداڵەکانتدا با متمانەیەکی پتەو هەبێت،
لە ڕێگەیەوە خەون و ئاواتەکانیان باس بکەن،
باسی خەمەکانیان بکەن!

۞۞۞

لە منداڵیدا وتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾

ئەو دەمەی عەزیزی میسربوو وتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾
باوەگیان
هەمان دەستەواژەی بەکارهێنا و نەگۆڕاوە،
ڕێزی باوکی گرت و بە ئەدەبەوە لەگەڵی دوا،
ڕۆژگار و پێگەکەی نەیگۆڕیبوو!
پێویستە ئێمەیش ئاوا مامەڵە لەگەڵ باوکماندا بکەین،
گەرچی خاوەنی بەرزترین بڕوانامە و پێگەیشبین.
چەندێ گەورەبین، لەلای ئەوان هەر منداڵەکەی جارانین.

۞۞۞

﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥﴾

واتە: یەعقوب(عليه السلام) وتی: ئەی کوڕی شیرینم، خەوەکەت بۆ براکانت مەگێڕەرەوە، نەوەك بەهۆیەوە فێڵ و پیلانێکت لێبکەن، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ بنیادەم.

لەبەر پارە و سامان حەسوودییان پێ نەبرد،
بەڵکوو بەهۆی خۆشەویستییەوە حەسوودییان پێ برد،
بەخشینەکانی دڵ، لە بەخشینەکانی دەست گرنگتر و بە بەهاترن!

۞۞۞

هەتا دەتوانیت نیعمەتەکان بشارەوە.
نیعمەتەکان بشارەوە،
چونکە دەروونەکان وەک یەک نین!

۞۞۞

هەندێ کەس حەزدەکەن خەونی باشیش نەبینیت،
پەنا بەخودا لەو دەروونەی،
خەونی باشیش پەستی دەکات.

۞۞۞

خەونەکانت باس مەکە،
نەبادا ئاگری چواردەورت بگرێت.
بە شاردنەوەی تایبەتمەندییەکانت،
ئاگری حەسوودەکان خامۆش بکە.

۞۞۞

هەموو نیعمەتێک،
کەسێک هەیە حەسوودی پێ ببات،
جا نیعمەتەکە گەورەبێت یان بچووک،
باشترین شت کە ئەنجامی بدەیت بەرانبەر کەسی حەسوود ئەوەیە،
نیعمەتەکانتی لێ بشاریتەوە!

۞۞۞

تەنانەت لەگەڵ براکانماندا،
لەگەڵ خزم و خۆشەویستاندا،
هەندێ بێدەنگی سەلامەتییە!

۞۞۞

فێڵ و پیلانی مرۆڤ،
لە مرۆڤی بەهێزەوە دێت بەرانبەر کەسی لاواز،
بەڵام پیلانی خودا،
بۆ بەرژەوەندی لاوازە لە دژی بەهێزا!

۞۞۞

خەڵکی لەسەر خەونەکانت ئیرەییت پێ دەبەن،
ئەی دەبێت چۆن بن بەرانبەر واقیعەکەت.
هەربۆیە هەموو شتەکانت بۆ خەڵکی ئاشکرا مەکە!
بۆ کەسانی چواردەورت کتێبێکی کراوە مەبە.

﴿وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ ٦﴾

واتـە: بـەو شـێوەیە پـەروەردگارت تـۆ دیـاری دەکات و هەڵتدەبژێرێـت بـۆ پێغەمبەرێتـی و هەندێـك لێکدانـەوەی خـەوت فێـر دەکات و نیعمەتەکانـی خۆیـت بەسـەردا تـەواو دەکات...

خواناس داوا لە خودا دەکات نیعمەتی پێ ببەخشێت،
بەڵام کەسی زانا داوای نیعمەت و تەواویەتی نیعمەتەکەش دەکات.

بیە هۆکاری بەختەوەری و شانازی خێزانەکەت.



# وێستگەی دووەم

## پیلانگێڕی براکان

«لەوەیە خەڵکی ڕقیان لێت بێت،
بەهۆی خەسڵەتە جوانەکانتەوە نەک نەنگییەکانت»

﴿لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧﴾

واتە: لە بەسەرهاتی یوسف(ﷺ) و براکانیدا،
پەندی زۆر هەن بۆ ئەو کەسانەی دەپرسن.

چیرۆکی یوسف(ﷺ) باسی حەقیقەتی ژیانی تۆ دەکات!

﴿إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٨﴾

واتە: کاتێک برایانی یوسف(عليه السلام) گوتیان: بێگومان یوسف(عليه السلام) و براکەی خۆشەویستترن لە ئێمە بەلای باوکمانەوە، خۆ ئێمەیش دەستەپیاوێکین، بەڕاستی باوکمان لە هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکرادایە.

۞۞۞

کەس گومانی نەدەبرد،
ئەم خۆشەویستییە، یوسف(عليه السلام) دەگەیەنێت بە زەوییەکی دوور،
چەندین پێشەکی هەن،
دەلالەت لە ئەنجامەکەیان ناکەن!

۞۞۞

لەوەیە خەڵکی ڕقیان لێت بێت،
بەهۆی خەسڵەتە جوانەکانتەوە نەک نەنگییەکانت.

۞۞۞

﴿ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ۝٩﴾

واتە: یوسف(عليه السلام) بکوژن، یا توڕی بدەنە زەوییەکی دوور، ئەو دەمە سەرنجی باوکتان تەنیا بۆ لای ئێوە دەبێت و لەدوای ئەوەوە بە تۆبە کردن دەبن بە کۆمەڵێکی چاکەکار.

لەو دەمەی قاڵبوون بە،
یوسف(عليه السلام) بکوژن، یوسف(عليه السلام) مەکوژن.
یوسف(عليه السلام) لە شوێنێکی تربوو،
قاڵبوو بە منداڵی خۆیەوە،
نەیدەزانی پیلان دادەنرێت بۆ لەناوبردنی منداڵییە پاکەکەی.

نەیانزانی بە ڕۆیشتنی ئازیزان و
دوورکەوتنەوەشیان،
خۆشەویستییەکەیان هەر دەمێنێت و
جەستە جێناهێڵێت!

لەگەڵ هەموو پیلانگێڕییەکاندا،
یوسف(عليه السلام) بووە پەیامبەر و عەزیزی میسر،
ئەو کەسەی خودا پشتیوانییەتی،
لە چی دەترسێت؟
لە کێ دەترسێت؟

پێی وتم: بینیت غیرە و ئیرەیی چی بە یوسف(عليه السلام) کرد؟
وتم: ئەی چۆن نازانم، کردی بە عەزیزی میسرا!
ئەو دەمەی چیرۆکەکان دەخوێنیتەوە،
لە یادت نەچێت باسی کۆتاییەکەیشی بکەیت!

لەوەیە ئەو بەڵایەی کە خۆشت ناوێت،
بتبات بەرەو قەدەرێک،
هێندە جوان بێت کە خەونت پێوە نەدیوە.

﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ١٠﴾

واتە: قسەکەرێك لەوان وتی یوسف(ﷺ) مەکوژن، بەڵکوو فڕێی بدەنە بنی بیرێکەوە، هەندێ لە کاروانییەکان دەی دۆزنەوە و هەڵی دەگرن، ئەگەر ئێوە کارەکە هەر دەکەن...

قسەکەرێک لەوان وتی...
گەر خودا ڕاستگۆیی و ئیخلاستی زانی،
گرنگ نییە خەڵکی ناو و ناونیشانت بزانن!

۞۞۞

تەنها پێشنیازێک بوو،
لێ ڕێڕەوی چیرۆک و مێژووی گۆڕی!
پێشنیاز و بۆچوونەکانت بەکەم مەزانە،
تۆ چوزانیت چ کاریگەرییەکی دەبێت!

۞۞۞

خستیانە ناو بنی بیرەوە،
چووە سەر تەختی پاشایەتی،
گەر هەمووان لەدژت پیلان بگێڕن،
تەنها ئەوە دێتە ڕێت کە خودا بۆی نووسیویت!

لەوەیە یەک وتەی تۆ،
ئازاری یەکێکیان کەم بکاتەوە،
یان بەتەواوی ئازارەکەی نەهێڵێت،
هەربۆیە بێدەنگ مەوەستە و بۆچوونی خۆت بڵێ!

بەسۆزیی و میهری خودا دەووری یوسفی(عليه السلام) دابوو،
لەنێوان فێڵ و پیلانگێڕی براکانیدا، دەنگێک بەرزبۆوە و وتی:
﴿لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ ۝١٠﴾
واتە: یوسف(عليه السلام) مەکوژن.
لەنێو بنی بیرەکەدا هاوارێک هات:
﴿يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ ۝١٩﴾
واتە: مژدەتان لێ بێت ئەمە کوڕێکە...
لە یەکەمین هەنگاویدا بەرەو کۆشک گوێی لە چرپەیەک بوو:
﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ ۝٢١﴾
واتە: ڕێزی لێ بنێ.

لەو دەمەی لە ماڵی عەزیزی میسردا بوهتانی بۆ کرا، گەواهی بۆ درا:
﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٢٧﴾﴾
واتە: گەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێت، ئەوا یوسف(عليه السلام) لە ڕاستگۆیانە.

لە کۆتا ڕۆژەکانی زینداندا، زولەیخا ددانی نا بەتاوانەکەیدا:
﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ﴿٥١﴾﴾
واتە: من دەست تێکەڵاویم لە یوسف(عليه السلام) ویست...

پێش ئەوەی لە زیندان دەرچێت پەیامێکی بۆ هات:
﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ﴿٥٤﴾﴾
واتە: شا گوتی: بیهێنن، تایبەتی دەکەم بە خۆم.

ئەو کەسەیشی وەک یوسف(عليه السلام) پاک و بێگەردە،
چاکەکارە، ئاکارپەسەندە،
بەسۆزیی و میهری خودا دەووری دەدات.

﴿قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ١١﴾

واتــە: گوتیــان: بابــۆ، لەبەرچــی تــۆ لێمــان دڵنیــا نیــت دەربــارەی یوســف(عليه السلام)، لــە کاتێکــدا کــە ئێمــە دڵســۆز و خەمخۆریــن بــۆی.

گومان بکە لە ئەمانەتی ئەو کەسەی لێت دەپرسێت:
بۆچی متمانەم پێ ناکەیت؟
گومان بکە لە ڕاستگۆیی ئەو کەسەی پێت دەڵێت:
بۆچی بەڕاستم نازانیت؟
گومان بکە لە دانایی ئەو کەسەی پێت دەڵێت:
بۆچی پشت بە من نابەستیت؟

﴿أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ١٢﴾

واتە: سبەینێ لەگەڵمان بینێرە بۆ دەرودەشت، بەئارەزووی خۆی خواردن بخوات و یاری بکات و بێگومان ئێمە پارێزگاری لێ دەکەین.

تەنانەت منداڵی پێغەمبەرانیش،
حەزیان بە یاریکردن هەبووە،
هەربۆیە خۆشی منداڵەکەت لەناو مەبە!

براکانی یوسف(عليه السلام) وتیان:

﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾

بێگومان پارێزگاری لێ دەکەین و ئاگامان لێی دەبێت.
یەعقوب(عليه السلام) پێی وتن:

﴿فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ﴾

کەواتە خوا چاکترین پارێزەرە!

ئەوان یوسفیان(عليه السلام) ون کرد و خودا پاراستی،
متمانەت بە خودا هەبێت و ئاسوودە بە.

﴿قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ
وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ﴿١٣﴾﴾

واتە: باوکیان وتی بەڕاستی دڵتەنگ و خەمبار دەبم کە ئێوە یوسف(عليه السلام) لەگەڵ خۆتان بەرن، دەترسم کە گورگ بیخوات لە دەمێکدا ئێوە لێی بێ ئاگا بن.

یەعقوب(عليه السلام) وتی: دەترسم گورگ بیخوات!
ڕۆژی دواتر کوڕەکانی وتیان: گورگ خواردی.
بەبێ ئەوەی ئاگامان لێ بێت،
چەندین بەڵگە و پاساومان داوە بە دوژمنەکانمان!

ئەو دەمەی یەعقوب(عليه السلام) فەرمووی:

﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ﴿١٣﴾﴾

واتە: دەترسم گورگ بیخوات.
یوسف(عليه السلام) و بینایی لەدەست دا!
ئەو دەمەی فەرمووی:

﴿إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴿٨٦﴾﴾

واتە: باسی سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم.
یوسف(عليه السلام) و بیناییەکەی بۆ گەڕایەوە!

﴿فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٥﴾

واتـە: ئینجـا کاتـێ یوسـفیان(ﷺ) لەگـەڵ خۆیـان بـرد ، هەمـوو بڕیاریانـدا بیخەنـە بنـی بیرەکـەوە و ئێمـە سرووشـمان بۆ یوسـف(ﷺ) کـرد، سـوێند بـە خـوا هەواڵـی ئـەم کارەیـان پـێ دەدەیـت کـە پێیـان کـردی، لـە کاتێکـدا ئـەوان هەسـت ناکـەن.

گەر هەموو جیهان کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانت پێ بگەیەنن بە شتێک،
بەڵام خودا بۆی نەنووسیبێت،
ئەوا ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن.

۞۞۞

ئەو کەسەی ستەمی لێ دەکرێت،
نامرێت، هەتا خودا پێشانی نەدات،
چی بە ستەمکارەکەی کردووە،
گەرچی ئەمە درێژەیش بکێشێت!

۞۞۞

﴿لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٥﴾

واتە: سوێند بە خوا هەواڵی ئەم کارەیان پێ دەدەیت کە پێیان کردی،
لە دەمێکدا ئەوان هەست ناکەن.

ئەو دەمەی پەنجەرەکان دادەخرێن،
خودا دەرگایەکت بۆ دەئافرێنێت.

لەنێو زریانی نائومێدیدا،
کەشتیی دڵخۆشی و هیوا دێت،
لەنێو بڵێسەی خەمدا،
گوڵی دڵخۆشیی دەپشکوێ.

﴿وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ ١٠﴾

واتە: بیخەنە نێو بنی بیرەوە. (نارەحەتییە)

﴿وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ ٢٣﴾

واتە: دەرگاکان داخران. (نارەحەتییە)

﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ ٣٦﴾

واتە: دوو لاو لەگەڵی چوونە زیندان. (نارەحەتییە)

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٥٦﴾

واتە: ئا بەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف(عليه السلام) و پایەدارمان کرد.

(دەروولێکردنەوە و فراوانییە).

بە سادەیی قەدەر مەخوێنەوە،
خودا کارساز و کاربەجێیە.

گەر لە نێوان براکانی یوسفدا(ﷺ)،
خوشکێک هەبووایە بەرگری لێ دەکرد!
لە ناخی دڵیدا دایدەنا، نەک لە ناخی بیرێک.

بەدوای یوسفدا(ﷺ) دەگەڕا،
وەک چۆن خوشکەکەی مووسا(ﷺ) ئەنجامیدا و
گەڕاندیەوە ئامێزی دایکی...
چونکە خوشکەکان،
هەرگیز ڕێگای بیر (الجُب) نازانن.
تەنها ڕێگای خۆشەویستی (الحُب) دەزانن.

﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨﴾

واتە: کراسەکەی یوسفیان(عليه السلام) هێنایەوە کە خوێنی درۆینەی پێوە بوو، باوکیان وتی: بەڵکوو دڵ و دەروونی خۆتان ئەم کارە ناپەسەندەی بۆ ئاسان و جوان کردوون، جا ئارام دەگرم بە ئارام گرتنێکی چاك و پەسەند، خوایش یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن.

خەمەکەی یەعقوب(عليه السلام) چەن بەسۆیە،
کراسی کوڕەکەی دەبینێت،
دوێنێ لەبەر کوڕەکەیدابوو،
ئێمڕۆ تەنها کراسەکەی دەبینێت و خەڵتانی خوێنی درۆینە کراوە.

ئێمە دەیپارێزین،
خواردن بخوات و یاری بکات،
گریان،
چووین پێشبڕکێ بکەین،
یوسفمان(عليه السلام) جێهێشت،
گورگ خواردی،
خوێن...
پێویستت بە کۆمەڵێک درۆ هەیە،
هەتا یەک درۆی گەیو بکەیت!

لەو کەسە بترسە،
پێش ئەوەی تۆ داوای لێ بکەیت،
بەڵگەکانی پێشکەش دەکات.

﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾

ئەوکەسەی لێی قەوماوە، تاکە چارەسەری ئارامگرتنە.
ئایا چ چارەیەکی تری هەیە؟
گەر ئارامیت نەما،
داوا لە خودا بکە ئارامیت بۆ زیادبکات،
هەتا ڕێگا سەختەکە دەبڕیت.
ئارامگرتنی چاک و پەسەند،
جوانترین کۆتایی هەیە،
وەک چۆن یەعقوب(عليه السلام) بەرانبەر نارەحەتییەکانی ئەنجامیدا.
ئەو ئارامگرییە جوانەی،
لە دەمێکدا یوسفی(عليه السلام) بۆ گەڕاندەوە،
هەم پەیامبەربوو، هەم عەزیزی میسر.

﴿وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾

ئەو دەمەی خەڵکی ئازارت دەدەن،
داوای یارمەتی لە خودابکە،
بە یارمەتی خودا ئازارەکانیان تێدەپەڕێنیت.

سوپاس یەعقوب(علیه السلام)، لە چیرۆکی تۆوە فێربووم، هەندێ جار لێدانەکان لە شوێنێکەوە دێن کە حیسابمان بۆی نەکردووە، لێدانی کەسە نزیکەکان زۆر بە ئازارترە لە بێگانەکان، چونکە ئەوان دەزانن ڕمەکەیان لەکوێ دەچەقێنن، چونکە تامی شەرمەزاری و هیوابڕاوی تێدایە، ئەو دەمەی منداڵەکەت سەلامەت بوو لە گورگەکان، سەلامەت نەبوو لە براکانی، ئەو دەمەی خەڵکی هیچ ئازارێکیان نەدایت، ئازار و لێدان لە کوڕەکانتەوە هات!

ئەدهەم شەرقاوی



## وێستگەی سێیەم

# بەرەو کۆشک

چەندین کاڵا،
لە فرۆشیارەکەیان بە بەهاترن.

﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ
وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩﴾

واتـه: کاروانـی هـات، ئاوکێشـیان نـارد، ئەویـش دۆڵچـەی داهێشـت، کـە دۆڵچەکـەی هێنایـە سـەرەوە، وتـی: مـوژدە، ئەمـە کوڕێکـە. ئـەوان یوسـفیان(علیه السلام) شـاردەوە کردیانـە کاڵای بازرگانـی، خـوا زانایـە بـەوەی ئەوانـە دەیکـەن.

چەندین کاڵا،
لە فرۆشیارەکەیان بە بەهاترن!

وتراوە: کاروانییەکە ڕێگایان لێ هەڵبووە و گەیشتونەتە سەر بیرەکە!
ئەو دەمەی خودا دەیەوێت ڕزگارت بکات،
ئەوانی تر وێڵ و ون دەکات لەپێناوی تۆدا!
بیرەکەیان پێشان دەدات، بۆ ئەوەی ڕزگارت بێت!
تینوویان دەبێت، بۆ ئەوەی تۆ بژیت!

گەر خەونەکانت کەوتە نێو بیری نائومێدییەوە،
خودا کاروانی (دەرووڵێکردنەوە)ی بۆ دەنێریت و دەری دەکەن!
تەنها متمانەت بە خودا بێت.

۞۞۞

لەوەیە خەونەکانت کەوتبێتنە بیری یوسفەوە(ﷺ)!
لێ دڵنیابە کاروانی بەختەوەری هەر دێت.

۞۞۞

﴿قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌۚ﴾

لەوەیە کەسێکی نزیکت نکوڵیت بکات و
کەسێکی دووریش ڕێزت لێ بنێت!
چونکە ئەوەی لەدوورەوە دەتبینێت،
وێنەکەت بە شێوەیەکی تەواو دەبینێت و
لە پێگەی خۆتدا دات دەنێت.

۞۞۞

﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً﴾

تێڕوانینی خەڵکی،
لە حەقیقەتی تۆ ناگۆڕێت،
ئەوان یوسفیان(ﷺ) کردە کاڵایەکی بازرگانی،
بەڵام لە حەقیقەتدا پێغەمبەرێکی بەڕێز و پادشایەکی مەزنبوو.

خودا دەستێک دەنێرێت بۆ ئەوەی،
لە تاریکی بیرەکە دەرت بهێنێت،
وەک چۆن یوسفی(ﷺ) دەرهێنا.
نوورێک دەنێرێت بۆ دڵت،
وەک چۆن ناردی بۆ چاوی یەعقوب(ﷺ).

﴿وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠﴾

بە نرخێکی کەم، بە چەند درهەمێك فرۆشتیان و نەشیاندەویست.

هەموو دونیا نرخێکی کەمە،
بەرانبەر پەیامبەرێکی بەڕێز،
چ جای چەند درهەمێکی کەم بێت!
چەندین کەسی بەنرخ و بە بەها،
بە هەرزانترین نرخ فرۆشران،
لەلای ئەوانەی کە قەدریان نەزانین!
هەر بۆیە خەمبارمەبە گەر قەدریان نەزانیت.

ئەو کەسەی ڕقی لێتە یان ئیرەییت پێ دەبات،
جوانی و بەهرەکانت نابینێت،
وەک براکانی یوسف(ﷺ) بە نرخێکی کەم دەتفرۆشێت.

براکانی یوسف(علیه السلام) ویستیان یوسف(علیه السلام) بکەنە ژێر زەوییەوە،
بەڵام خودا ویستی لەسەر زەوی بڵندی بکات.
بەنرخێکی کەم فرۆشتیان،
بۆ ئەوەی دواتر داوای خواردنی لێ بکەن!
متمانەت بە خودا هەبێت،
گەر خودا پشتیوانت بێت،
وادەکات پیلانی دوژمنان بەسەر خۆیاندا بشکێتەوە!

ئەو دەستانەی زوڵمیان لە یوسف(علیه السلام) کرد و
بەنرخێکی کەم فرۆشتیان،
هەر ئەوانە دەستیان لەبەردەمیدا پانکردەوە و وتیان:

﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ ۖ ﴿٨٨﴾﴾

واتە: خێرمان پێ بکە!

بۆ خودا:

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾

واتە: بەوشێوەی شایەنیەتی قەدری خودایان نەگرت.

بۆ یوسف(عليه السلام):

﴿وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ﴾

واتە: لێی بێ پێویستبوون.

بۆ موحەممەد(صلى الله عليه وسلم):

﴿يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾

واتە: ئەو دەمەی دەتبینن گاڵتەت پێ دەکەن.

خەمبارمەبە گەر قەدریان نەزانیت.

ئەو منداڵەی فڕێ درایە نێو بنی بیرەوە،
دواتر بەنرخێکی کەم فرۆشرا،
هێدی هێدی ئامادەدەکرا بۆ ئەوەی ببێت بە عەزیزی میسرا!
سەختی و ناڕەحەتییەکانی ئیمڕۆی ژیانت،
تەنها پێشەکییەکە بۆ جوانترین ڕۆژەکانی ژیانت!
گومانی باشت بە خودا هەبێت.



# وێستگەی چوارەم

## فێڵی ئافرەت

تاکە ڕاکردن کە کەسە ئازاکان ئەزموونی دەکەن و
ترسنۆکەکان ناتوانن ئەزموونی بکەن،
ڕاکردنە لە تاوان و ڕاکردنە بەرەو لای خودا!

﴿وَقَالَ ٱلَّذِی ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِی مَثْوَىٰهُ﴾

ئەو کەسەی لە میسر یوسفی(ﷺ) کڕی بە ژنەکەی گوت: ڕێزی لێ بگرە.

گەر خودا ویستی لێبوو چاکەیەک بهێنێتە ڕێت،
هاندەر و پاڵنەر دەخاتە دڵی چواردەوورەکەتەوە و
بەهۆیەوە چاکەت لەگەڵ دەکەن و خزمەتت دەکەن.

بنیادەم بە گرنگترین خەسڵەتەکانی تاریف دەکرێت،
لێرەدا بە عەزیزی میسر تاریف نەکرا،
بەڵکوو بەوەی کە یوسفی(ﷺ) کڕیوە...
لەوەیە لە ژیانتدا کارێک ئەنجام بدەیت،
لە هەموو ژیانت گرنگتر بێت!

کەسی نزیک وتی: ﴿ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ﴾
واتە: یوسف(عليه السلام) بکوژن!

بەڵام بێگانەکە وتی: ﴿أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ﴾
واتە: ڕێزی لێ بنێ!

خۆشەویستی ڕۆزییە،
نازانیت ڕۆزییەکەت لە چ دڵێکدایە!

۞۞۞

تۆ چوزانیت؟
لەوەیە ئەو کەسەی ئێستا خزمەتکارتە،
یەکێک بێت لە پیاوچاکانی خودا،
هەربۆیە ڕێزی ژێردەستەکانت بگرە.

۞۞۞

﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ٢١﴾

واتە: خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە.

لــە چیرۆکــی یوســفدا(عليه السلام)، هەمیشــە کۆتاییــەکان لــە ســەرەتاکان جیــاوازن.
لەو دەمەی باوکی خۆیشی ویست، فڕێدرایە بیرەوە!
لەو دەمەی براکانی ویستیان نەوی بکەن، باڵاتربووا!
لەو دەمەی زولەیخا ویستی زەلیلی بکات، خودا بە عیززەتی کردا!
لەو دەمەی کرایە زیندانەوە، بوو بە عەزیزی میسرا!
هۆکاری هەموو ئەوانەیش ئەوەیە:

﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ٢١﴾
خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە.

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٢﴾

واتە: کاتێک بوو بە پیاو و پێگەیشت، سەلیقە و زانیاریمان پێدا، ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

بەخششەکان لەو دەمەدا نایەن کە تۆ هەڵیدەبژێریت،
بەڵکوو لەو دەمەدا دێن کە سوودی زۆرترە بۆت،
ئارام بە و متمانەت بە خودا هەبێت.

۞۞۞

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٢ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾

خودا سەرەتا باسی پێدانی زانیاری و چاکەکردنی لەگەڵ یوسفدا(عليه السلام) کرد،
ئینجا باسی چیرۆکی خێزانی عەزیزی میسری کرد.
گەر ویستت شتێک باس بکەیت،
شتەکەیش لەلای خەڵکی نەنگی و هەڵەبوو،
لێ تووشی کەسێکی باش هاتبوو،
ئەوا لەپێشدا باسی شتە باشەکانی بکە،
ئینجا ئەوەی تری باس بکە.

۞۞۞

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣﴾

واتە: ئەو ئافرەتەی یوسف(عليه السلام) لەماڵیدا بوو، دەست تێکەڵاوی لە یوسف(عليه السلام) ویست و هەموو دەرگاکانی داخست و وتی: وەرە پێشەوە بەپەلە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە، یوسف(عليه السلام) وتی: من پەنا دەگرم بە خوا ئەو ئاغامە، ڕێزی لێ گرتووم، بەڕاستی ستەمکاران ڕزگار نابن.

هەندێ کەس گومانیان وایە،
گەر بەشێکیان پێ بەخشیت لە دونیاکەیان،
پێویستە تۆ بەشێک لە دینەکەتی پێ ببەخشیت.

۞۞۞

زولەیخا دەرگاکانی لە یوسف(عليه السلام) داخست،
یوسف(عليه السلام) خۆی پاراست و پەنای بە خودا گرت،
خوداش دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کردەوە.

۞۞۞

هەموو فیتنە و ئارەزوویەک دەرگای خۆی هەیە،
ئاگاداری ئەو دەرگایانە بە و بە باشی دایان بخە،
پێش ئەوەی بەسەرتدا دابخرێن!

۞۞۞

لەو دەمەی زولەیخا بانگی کرد بۆ خراپە، فەرمووی:
﴿مَعَاذَ ٱللَّهِ﴾
واتە: پەنا دەگرم بە خودا.
لە کاتی فیتنەدا، فەرمووی:
﴿رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ﴾
واتە: خودایە زیندان لەلام خۆشترە لەوەی ئەوان بانگم دەکەن بۆی.
لە زیندان فەرمووی:
﴿ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا﴾
واتە: ئەوە لە فەزڵ و بەهرەی خودایە بەسەرمانەوە.
لە کاتی دەرووڵێکردنەوە فەرمووی:
﴿قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ﴾
واتە: خودا منەتی نا بەسەرماندا.
لەو دەمەی گەیشت بە ئازیزانی:
﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ﴾
واتە: خودا چاکەی لەگەڵ کردم...
پێویستە لە هەموو دۆخێکدا ناوی خودا لەسەر زارت بێت،
هەرگیز فەزڵی خودات لە یاد نەچێت!

۞۞۞

لەو دەمەی مۆبایلەکەت بەدەستەوەیە،
یان تەماشای تەلەفزیۆن دەکەیت،
یان بە تەنها لە شوێنێکیت،
فیتنە و تاوان پێت دەڵێن:
«وەرە پێشەوە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە»
تۆش وەک یوسف(عليه السلام) بڵێ:
«پەنا دەگرم بە خودا»

زولەیخا لە دەروونیدا هەموو دەرگاکانی داخستبوون،
بەڵام لە دەروونی یوسفدا(عليه السلام)،
هێشتا دەرگای چاودێری خودا کراوەبوو.

یوسف(عليه السلام) لاوێکی هەرزەکاربوو،
لە وڵاتی خۆیدا نەبوو،
ژێردەستەی ئافرەتێکی جوانی خاوەن دەسەڵات بوو،
لە ماڵی ئەودابـوو،
دووربوو لە چاودێری خەڵکی،
ترسی ئابڕووچوونی نەبوو،
لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، لە خراپەکە ڕایکرد و
داوای کرد خودا بیپارێزێت و
پەنای بە خودا گرت!

﴿وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ
وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِۚ ٢٥﴾

واتە: یوسف(ﷺ) و ئافرەتەکە هەردووکیان بۆ لای دەرگاکە ڕایان کرد و ئافرەتەکە کراسەکەی یوسفی(ﷺ)لە دواوە دڕاند، جا هەردووکیان تووشی مێردی ئافرەتەکە بوون لەبەردەم دەرگاکە..

کەسی ئازا و دلێر ئەو کەسەیە،
لە فیتنە و شوێنەکەیشی ڕادەکات،
بوێری ئەوە ناکات لەبەر دەرگاکەیشی بوەستێت.

به تەنها بە (پەنا دەگرم بە خودا) ڕازی مەبە،
بەڵکوو بەدوای نزیکترین دەرگادا بگەڕێ و
ڕابکە...

هەردووکیان ڕایاندەکرد،
یەکێکیان لە تاوان ڕایدەکرد،
ئەوی تریش ڕایدەکرد بۆی.
لەوەیە لە ڕووکەشدا هاوبەش بین،
بەڵام پاداشتەکەمان جوودابێت،
ئەمەیش بەهۆی نیەتمانەوەیە!

تاکە ڕاکردن کە کەسە ئازاکان ئەزموونی دەکەن و
ترسنۆکەکان ناتوانن ئەزموونی بکەن،
ڕاکردنە لە تاوان و ڕاکردنە بەرەو لای خودا!

﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾

﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ﴾

واتە: ئافرەتەکە کراسەکەی یوسفی(عليه السلام) لەدواوە دڕاند.

لەوەیە یوسف(عليه السلام) لەم ساتەدا گومانی وابووبێت تیاچووە،
نەیزانی ئەمە دەبێتە بەڵگەیەک بۆ ئەوەی پاکیەتی دەربخات،
بە سەرکەوتنە کاتییەکانی زاڵم خەمبارمەبە!

خەمبار مەبە بۆ،
کراسە دڕاوەکەت،
ماڵە براوەکەت،
ئەسرینە ڕژاوەکەت،
مافە خوراوەکەت.
لەوەیە ببنە هۆکاری ڕزگاربوون و
سەرەتای بەختەوەریت.
خودا لە کەوتنە ئاسانەکەت،
داهاتووە مەزنەکەت بونیاد دەنێت.

۞۞۞

﴿وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِۚ﴾

واتە: لە بەردەم دەرگاکە گەیشتن بە عەزیزی میسر.

دڵنیابووە لەو دەمەدا نایەت،
بەڵام چ شتێک ئەوی هێنا؟
بێگومان خودا!

۞۞۞

دەرگاکانی داخست بۆ ئەوەی هیچ کەسێک نەیبینێت،
بەڵام دواتر لەبەر دەرگاکە تووشی مێردەکەی بوو،
ئەو کەسەی خودا نەیپۆشێت، هیچ ڕێگایەک نییە بۆ پۆشینی!

۞۞۞

یوسف(ﷺ) ڕایکرد،
بەڵام لەبەر دەرگاکە گەیشت بە عەزیزی میسر،
هەندێ جار بەڵاکان لە چەندین بەش پێکدێن،
ئارامبگرە هەتا خودا دەرووت لێدەکاتەوە!

﴿قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ
قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٦ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن
دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٧﴾

واتە: یوسف(عليه السلام) وتی: ئەو ژنە داوێنپیسی لە من ویستووە، ئەوسا شایەتێك لە كەس و كاری ئەو ئافرەتە شایەتیدا، وتی ئەگەر كراسەكەی یوسف(عليه السلام) لای پێشەوە دڕێنرابێ، ئەوە ئافرەتەكە ڕاست دەكات و یوسف(عليه السلام) لە درۆزنانە. ئەگەریش لە پشتەوە دڕێنرابێت ئەوا ئافرەتەكە درۆدەكات و یوسف(عليه السلام) لە ڕاستگۆیانە.

كەسە پاكەكان،
زاریان هێمنانە دێتە گۆ،
بە متمانەوە قسە دەكەن و
دوور لە دەنگ بەرزكردنەوە و سوێند خواردن،
هەوڵنادەن بە زۆر قەناعەتت پێ بهێنن...

﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ﴾
ئەو دەمەی بەندە تەقوای خودای دەبێت،
خودا دەرووی لێدەکاتەوە،
نارەحەتییەکانی لەسەر لادەبات.
تەنانەت نزیکترین کەسی نەیارەکانی پشتگیری دەکەن و
گەواهی بۆ دەدەن.

۞۞۞

﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ﴾
واتە: گەر کراسەکەی لەدواوە دڕێندرابێت...

لە میهری خوداوە ئەوەیە کە،
بەندەکەی بە بەڵا ڕزگار دەکات،
بەڵکوو بەشوێنی بەڵاکە ڕزگاری دەکات.
ئەو دەمەی یوسف(ﷺ) ڕایکرد،
خوازیارییبوو دەستی بە کراسەکەی نەگات،
لێ بە بەهێزییەوە دەستی پێی گەیی و دڕاندی.
یوسف(ﷺ) زۆری پێ ناخۆشبوو،
بەڵام بووە ئەو دەلاقەی خودا لێیەوە ڕزگاری کرد!

۞۞۞

﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ۚ وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ ۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ﴾

واتە: ئینجا ڕووی کردە یوسف(عليه السلام) وتی: ئەی یوسف(عليه السلام)، ئەم باسە فەرامۆش بکە و گوێی مەدەرێ، تۆیش داوای لێخۆشبوون و لێبووردن بکە لە هەڵە و تاوانەکەت، چونکە بەڕاستی تۆ لە گوناهباران و بەهەڵەچواندایت.

تەنانەت زمانیشی بەدوورگرت لەوەی ناوی خێزانەکەی بهێنێت،
وەک ئەوەی هەست بە قێزەونییەکەی دەکات!
پاکی و بێگەردی، بە بەهاترین شتی ئافرەتە،
بەبێ ئەوە بێ بەهایە.

۞۞۞

﴿وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ ۖ﴾

واتە: تۆیش داوای لێخۆشبوون و لێبوردن بکە لە هەڵە و تاوانەکەت.

تەنانەت بێ باوەڕانیش زینا وەک تاوانێکی گەورە تەماشا دەکەن و پێویستە تەوبەی لێ بکرێت.
نەک ئازادی تاکە کەسی بێت و
پێویست بێت بێدەنگ بیت بەرانبەری.

۞۞۞



# وێستگەی پێنجەم

## داپۆشینی خودا

گەر خودا داپۆشینی خۆیمان لەسەر هەڵبگرێت،
دەبینە قسە و باسی کۆڕ و دانیشتنەکان...

﴿وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٣٠﴾

واتـە: دەسـتەیەك لـە ژنانـی شـار بـە تەشـەرەوە وتیـان: ژنەکـەی عەزیـزی میسـر دەیەوێـت لەگـەڵ غوڵامەکـەی داوێنپیسـی بـکات، لـە دڵداریـدا سـووتاوە، بەڕاسـتی ئێمـە ئـەو ژنـە دەبینیـن لـە گومڕاییەکـی ڕوون دایـە.

گەرچی دەرگاکانی داخست،
بەڵام ئابڕووچوونەکەی لە هەموو شاردا بڵاوبوویەوە،
لەو دەمەی سەرپێچی خودا دەکەیت،
لە پیلانی خودا بێ خەم مەبە!

گەر خودا داپۆشینی خۆیمان لەسەر هەڵبگرێت،
دەبینە قسە و باسی کۆڕ و دانیشتنەکان...
پەروەرێنە داپۆشینی خۆتمان لێ هەڵنەگریت.

ئەو دەمەی ئافرەتەکان جوانی یوسفیان(عليه السلام) بینی،
هەستیان بە ئازاری بڕینی دەستیان نەکرد.
ئەو دەمەی جوانی ئافرێنەری یوسف(عليه السلام) دەبینیت،
هەموو ئازار و خەمەکانت لەیاد دەکەیت.
خودایە لە دیدار و بینینی خۆت بێ بەشمان نەکەیت.



# وێستگەی شەشەم

## لە زیندانەوە

تەماشای تاریکیی بەڵاکەت مەکە،

بەڵکوو تەماشای ئەو ڕووناکییە بکە کە لەودیوی بەڵاکەوەیە!

﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ ٣٣﴾

واتـه: یوسـف(ﷺ) وتـی: ئـەی پـەوەردگارم بەندکردنـم لا خۆشـترە لـەوەی کـە ئەوانـە داوای دەکـەن لێـم بیکـەم.

بەندکردنی لەلا خۆشتربوو.
لەگەڵ خودا،
بەندکردن خۆشییە!

کەسانی چاک،
ئازادییەکەیان دەکەنە قوربانی،
هەتا ئایینیان سەلامەت بێت.
چونکە سەلامەتی ئایین،
لە پێش سەلامەتی دونیاوەیە!

﴿أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِۖ﴾
واتە: لەوەی کە ئەوانە داوای دەکەن لێم بیکەم!

نەیوت: زینا!
تەنانەت زمانیشی پاک و بێگەردبوو!

﴿وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ٣٣﴾

واتە: ئەگەر گەری ئەوانەم لێ لانەدەیت، دڵم دەڕوا بۆ لایان و دڵم بۆ لایان دەچێ و یەکێک دەبم لە نەزانان.

بنواڕە، بەبێ خودا هیچ نیت.
یوسف(عليه السلام) نەیوت من کوڕی پەیامبەرم!
بەڵکوو خۆی بەریکرد لە کەسانی چواردەووری و
پەنای بۆ خودا برد،
خوداش پاراستی!

﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٤﴾

واتە: ئەوسا پەروەردگاری نزای لێ وەرگرت و پیلانەکەی ئەوانی لێ لادا، بەڕاستی هەر خودا بیسەری زانایە.

هەر کەسێک بەڕاستی پەنا بۆ خودا ببات و
داوای یارمەتی لێ بکات،
ئیللا خودا وەڵامی دەداتەوە و لێی ناگەڕێت بۆ نەفسی خۆی.

فەرمووی: دوعاکەی لێ وەرگرت.
نەیفەرموو: خستییە بەندیخانەوە.
تەماشای تاریکی بەڵاکەت مەکە،
بەڵکوو تەماشای ئەو ڕووناکییە بکە کە لەودیوی بەڵاکەوەیە!

﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ ٣٦﴾

واتە: ئەوسا دوو کوڕی لاو لەگەڵی چوونە زیندانێ!

لە سەرەتای ناڕەحەتییەکاندا،
هەنگاوەکانی دەروولێکردنەوە دەست پێ دەکەن.
لەگەڵی چوونە زیندان، نەک لە دوای ئەو،
دواتر یەکێکیان بووە هۆکاری ڕزگاربوونی!

۞۞۞

هەر دەمێک ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە:
﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ ٣٦﴾
ئیللا خەم و ئازارەکانم لەلا سانا دەبن،
چونکە تەنها من ئازار و خەمم نییە!

۞۞۞

﴿إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ٣٧﴾

واتە: ئایینی ئەو کەسانەم وەلا ناوە، کە نە بڕوایان بە خوا هەیە، لاشیان وایە قیامەت نایەت.

یوسف باسی ستەمی براکانی نەکرد،
باسی بوختانی زولەیخای نەکرد،
بەڵکوو خۆی لەوە بە گەورەتر زانی و،
خەمی بانگەوازەکەی بووا!

مرۆڤ کاتێکی فراوانی لەبەردەمە بۆ بانگەوازکردن،
بنواڕە یوسف(عليه السلام)،
لەو دەمەی خزمەتکاربوو، بانگەوازی بۆ لای خودا دەکرد.
لەو دەمەی لە زیندان بوو، بانگەوازی بۆ لای خودا دەکرد.
لەو دەمەی عەزیزی میسربوو، بانگەوازی بۆ لای خودا دەکرد.

﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٣٨﴾

واتە: شوێنی ئایینی باوانم کەوتووم کە ئیبراهیم(عليه السلام) و ئیسحاق(عليه السلام) و یەعقوبن(عليه السلام)، ڕەوا و شیاو نییە بۆمان کە هیچ شتێ بکەین بە هاوبەش بۆ خوا، ئەمە چاکە و بەهرەی خوایە بەسەر ئێمەوە، بەسەر خەڵکیشەوە، لێ زۆربەی خەڵکی سوپاسی خوا ناکەن.

﴿ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا﴾

یوسف(عليه السلام) لە دەمێکدا ئەمەی گوت،
لە زینداندابوو، لە غوربەتدابوو، ستەمی لێکرابووا!
خەمەکانت چەندێ زۆربوون،
هێشتا کۆمەڵێک نیعمەت و شتی جوان هەیە کە لەبارەیەوە بدوێیت.
بنوارە فەزڵی خودا،
نەک بەڵا و نارەحەتییەکان!
بڕوانە لایەنە ئەرێنییەکان،
نەک لایەنە نەرێنییەکان.

یوسف(علیه‌السلام) لە زینداندابوو، بەڵام باسی بەهرەی خودای دەکرد بەسەریەوە، فەرمووی:

﴿ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا﴾

پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) لە ئەشکەوتدابوو، بە یاوەرەکەی فەرموو:

﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾

واتە: خەمبار مەبە، خودا لەگەڵمانە.

یونس(علیه‌السلام) لە سکی نەهەنگدا فەرمووی:

﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

واتە: بەڕاستی هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە، بێگومان من لە ستەمکاران بووم.

لەلای نیلدا مووسا(علیه‌السلام) فەرمووی

﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ﴾

واتە: بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایە و ڕێنموونیم دەکات بۆ ڕزگاری.

لەگەڵ خودابە،
هەموو نارەحەتییەکان تێدەپەڕێنیت،
جا لە هەر شوێنکیش بیت!
دڵت تەنها وابەستە بکە بەخوداوە و
چاوەڕێی دەروولێکردنەوە بکە!

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ٤٢﴾

واتە: یوسف(عليه السلام) وتی بەوەی کە دەیزانی ڕزگاری دەبێت لە دوو بەند کراوەکە، باسم بکە لای ئاغات کە بە ناهەق گیراوم، بەڵام شەیتان لە بیری بردەوە، بۆیە ماوەی چەند ساڵێك یوسف(عليه السلام) لە گرتووخانە مایەوە.

سوننەتی خودا بزانە لە ئافرێنراوەکانیدا،
ئەو دەمەی ئادەم(عليه السلام) لە بەری درەختەکەی خوارد،
بۆ ئەوەی نەمری پێ ببەخشرێت،
بە دەرچوون لە بەهەشت سزادرا!
ئەو دەمەی یوسف(عليه السلام) داوای لە ڕزگاربووەکە کرد،
لەلای گەورەکەی باسی بکات،
چەند ساڵێک لە بەندیخانەدا مایەوە!
تەنها داوا لە خودا بکە و
ئۆمێدت هەر بە قاپی ئەو هەبێت.

﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾

وادابنێن لەو دەمەدا باسی کرد،
یوسف(ﷺ) دەبووەوە خزمەتکار.
لێ چەند ساڵێک دواکەوت،
بۆ ئەوەی ببێتە عەزیزی میسر.
دواکەوتنەکان چەندین حیکمەتیان تێدایە!

۞۞۞

﴿فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ٤٢﴾

واتە: ماوەی چەند ساڵێك یوسف(ﷺ) لە بەندیخانەدا مایەوە.

نارەحەتییەکەی درێژەی کێشا،
یوسفیش(ﷺ) خۆڕاگربوو، بێزارنەبوو.
خۆڕاگربە لەسەر دۆخە نارەحەتەکەت،
بەمزووانە خودا دەرووت لێدەکاتەوە و
قەرەبووت بۆ دەکاتەوە!

۞۞۞

خودا یوسفی(ﷺ) فێرکرد چۆن لە هەموو هۆکارەکان دابڕێت و تەنها ڕووبکاتە خۆی.
نەیهێشت کارەکەی لەسەر دەستی بەندەیەک ڕایی ببێت،
یان هۆکارێـک بێت، پەیوەندی بە بەندەیەکەوە هەبێت!



# وێستگەی حەوتەم

## خەونی شا

لە بەسۆزیی خودا ئەوەیە،

ئەو شتەی کە هۆکار نییە، دەیکاتە بەهێزترین هۆکار.

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ
وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن
كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ٤٣﴾

واتـه: شـا گوتـی: بێگومـان مـن لـه خەومـدا حـەوت مانـگای قەڵـەوم بینـی، کـە حـەوت مانـگای لـەڕ دەی خـواردن، حـەوت گوڵـە دانەوێڵـەی سـەوز و حەوتـی وشکیشـم بینـی، ئـەی پیـاو ماقـووڵان ئـەم خـەوەم بـۆ لێکبدەنـەوە، گـەر ئێـوە مانـای خـەو دەکـەن و دەزانـن خەوپەرژێـن بکـەن.

ڕاز و خەون و بیرۆکەکان لە سەری مرۆڤەکاندا،
بە فەرمانی خودا کاردەکات.
ئەو دەمەی خودا دەیەوێت ڕزگارت بکات،
ڕاز و خەونیان دەگۆڕێت لە پێناوی تۆدا.

خەونێک بووە هۆکاری ڕزگارکردنی یوسف(عليه السلام).
لە بەسۆزیی خودا ئەوەیە،
ئەو شتەی کە هۆکار نییە، دەیکاتە بەهێزترین هۆکار.

نائومێد مەبە گەر نارەحەتییەکانت زیادیان کرد،
کلیلی ڕزگاربوونت لەلای خودایە،
ڕزگاربوونی یوسف(عليه السلام) بەهۆی خەونێکەوەبوو!

﴿قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ﴿٤٤﴾﴾

وتیان خەونەدرۆزنەن و ئێمەش لەم تەرزە خەونانە سەردەرناکەین.

لە پێناوی تۆدا،
خودا دەرگای شتەکانیان بەسەردا دادەخات،
بۆ ئەوەی دەرگایەک بۆ تۆ بکرێتەوە و
ڕزگارت ببێت.

۞۞۞

پاشا بەدوای خەوزانێکدا وێڵە خەوەکەی بۆ لێکبداتەوە،
ئەمەش بووە سەرەتایەک بۆ ئەوەی،
زیندانییەکی ستەملێکراو ڕزگاری ببێت،
کە هیچ ئاگای لە کارەکە نەبوو.
لەوەیە دڵخۆشبوون و ڕزگاربوون لە ڕێگابن بەرەو لای تۆ و
تۆش ئاگات لێی نەبێت.

۞۞۞

﴿وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾
واتە: وتیان ئێمە لێکدانەوەی خەوی تێکەڵ و پێکەڵ نازانین.

دوای ئەوەی ددانیان نا بە نەزانینی خۆیاندا،
بەدوای یوسفدا(ﷺ) گەڕان و
ئەویش وڵاتی لە برسێتی و قاتوقڕی ڕزگارکردا!
ئەو دەمەی دەڵێیت: (نازانم)!
گەورەترین خزمەتت پێشکەش کردووە.

﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ ٤٦﴾

سەرت نەسوڕمێت لە گۆڕانی مامەڵەی هەندێ کەس،
یوسف(عليه السلام) لەلای ئەوان تۆمەتباربوو،
بەڵام کە پێویستیان پێی بوو،
پێیان وت: یوسف(عليه السلام) ئەی هاوڕێی ڕاستگۆ!

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ ﴿٤٨﴾﴾

واتـە: ئینجـا لـە پـاش ئـەو حـەوت سـاڵە، حـەوت سـاڵی تـر دێـت کـە سـەخت و قـات و قڕییـە.

ساڵە سەخت و نارەحەتەکان نەتترسێنن،
ساڵە سەختەکان یوسفیان(عليه السلام) کردە عەزیزی میسر،
لەدوای ماوەیەکی زۆریش بەدیداری براکانی شادبوو.
هەندێ نارەحەتی،
چەندین گەنجینە و دەرگای داخراوت لێدەکاتەوە!
لە نێو نارەحەتی و سەختییەکاندا، بەدوای نیعمەتدا بگەڕێ.

﴿ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾﴾

واتە: لەوەودوا ساڵێکی باراناوی و پڕ بەرەکەت دێت، کە خەڵکی بەروبوومی زۆریان پێ دەبەخشرێت، میوە دەگوشن و شەربەتی لێ دروست دەکەن.

خەمبارمەبە گەر نارەحەتیت تووشبوو،
دەرووولێکردنەوەت نزیکە،
نارەحەتییەکەت چەندێ درێژە بکێشێت،
ڕزگاربوون و بەختەوەری هەر دێت،
لە ڕەحمەتی خودا نائۆمێد مەبە.
لەدوای هەورەگرمە، هەر بارانی ڕەحمەت دێت.
لە کاتی ناخۆشیدا خۆڕاگربە،
لە کاتی خۆشیدا شوکرانەبژێربە.

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ
إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣﴾

واتە: یوسف(عليه السلام) وتی: من هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم، چونکە بەڕاستی نەفس زۆر فەرمان دەرە بە خراپە، بێجگە ئەو نەفسەی پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێت، بەڕاستی پەروەردگارم خەتابەخش و میهرەبانە.

پاکانە بۆ نەفسی خۆت مەکە،
گەرچی پاکی و ئارامی و تەقوای یوسفیشت(عليه السلام) هەبوو.

کاتی بەتاڵ و بێئیشی،
زۆرترین زیان لە نەفس دەدەن،
چونکە نەفس بێئیش دانانیشێت،
گەر قاڵی نەکەیت بەوەی سوودی پێ دەگەیەنێت،
قاڵت دەکات بەوەی زیانت پێ دەگەیەنێت.

﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ٥٥﴾

واتە: یوسف(عليه السلام) فەرمووی بە شا، لەسەر خەزنە و دارایی میسر دامبنێ، بەڕاستی من پارێزەرێکی شارەزام.

ئێستا دەوڵەتە ئیسلامییەکان هێندە سامانی سروشتی و
داهاتیان هەیە،
کە بێ پێویستیان دەکات لە وڵاتەکانی تر.
بەڵام ئایا پیاوانێکیان هەیە، وەک یوسف(عليه السلام) بەڕێوەیان ببات؟

۞۞۞

﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾
واتە: بەڕاستی من پارێزەرێکی شارەزام.
ڕاستترین CV کە نووسرابێت...

۞۞۞

﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾
ئەو دەمەی خەڵکی پێویستیان پێتە،
تەوازوعەکەت لەلایەک دابنێ و
بێرە گۆ بە تایبەتمەندییەکانت!

۞۞۞

خودا کارەکانی یوسف پێغەمبەری(ﷺ) بەڕێوەبرد.
لە سارادا، کاروانییەکانی پێویست بە ئاو کرد،
بۆ ئەوەی لە بیرەکە دەری بهێنن.

دواتر عەزیزی میسری پێویست بە منداڵ کرد،
بۆ ئەوەی یوسف(ﷺ) بەخێوبکات.

دواتر پاشای پێویست بە خەوزانێک کرد،
بۆ ئەوەی لە زیندان ڕزگاری بکات.

دواتر هەموو میسری پێویست بە خواردن کرد،
بۆ ئەوەی بکرێتە عەزیزی میسر.

کە خودا کارەکانتی بەڕێوەبرد،
هەموو هۆکارەکانی خۆشبەختیت بۆ ئاسان دەکات،
لە کاتێکدا ئاگات لە هیچ نییە.

خۆت و کارەکانت بسپێرە بە خودا......

یوسفی ڕاستگۆ(عليه السلام) لەگەڵ دوو لاوی تردا لە زینداندا بوون،
یوسف(عليه السلام) بە دڵ و ڕووکەش لە ئەوان جوانتر بوو.

بەڵام خودا پێش یوسف(عليه السلام) دوو لاوەکەی لە زیندان ئازاد کرد،
یوسف(عليه السلام) دوای ئەوان بە چەند ساڵێک لە زیندان مایەوە.

یەکەمیان بووە خزمەتکار، دووەمیش لە خاچ درا!
یوسف(عليه السلام) بە ماوەیەکی زۆر دوای ئەوان ئازادکرا،
بۆ ئەوەی ببێتە عەزیزی میسر.

خودا بەدیهێنانی ئاوات و خولیاکانت دوا دەخات،
بۆ ئەوەی زیاتر و زۆرترت پێ ببەخشێت!

یوسف(ﷺ) داوای لە شا کرد بیخاتە سەر خەزنەی وڵات،
بەڵام خودا باسی وەڵامی شای نەکردووە، بەڵکوو فەرموویەتی:

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ٥٦﴾

واتە: بەو جۆرە یوسفمان(ﷺ) لە خاکی میسردا پایەدار و جێگیرکرد.

چونکە بکەری حەقیقی خودایە،
چونکە خودا وای لە شا کردووە قبووڵی بکات،
هەربۆیە وەڵامدانەوەکە باسنەکراوە!



# وێستگەی هەشتەم

## شادبوونەوەی یوسف(علیه السلام) بە براکانی

لە ناوەڕاستی هەموو ناڕەحەتییەکدا،

خودا کەسێکت بۆ دەنێرێت، هەتا ڕاوەستاو و ئارام بیت.

﴿وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴿٥٨﴾﴾

واتـە: براکانـی یوسـف(ﷺ) هاتـن بـۆ میسـر، جـا چوونـە دیوانـی، ئـەو ئەوانــی ناســییەوە، بــەڵام ئــەوان ئەمیــان نەناســییەوە.

گەر پێش چەند ساڵێک بهاتنایە،
یوسف(ﷺ) غوڵامێک بوو لە کۆشکدا یان،
لە زینداندابـوو.
بەڵام ئێستا هاتوون،
لەو دەمەی یوسف(ﷺ) عەزیزی میسرە.
خەمبار مەبە،
گەر سەرکەوتنت، دەوڵەمەندیت، بەختەوەریت دواکەوت،
خودا دەیەوێت بە باشترین و جوانترین شێوە ئەوانەت پێ ببەخشێت!

﴿قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًاۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴿٦٤﴾﴾

واتـە: یەعقـوب(عليه السلام) وتـی پێیـان: ئایـا دڵنیابـم لێتـان دەربـارەی، هـەروەك پێشـتر دڵنیابـووم لێتـان دەربـارەی یوسـفی بـرای(عليه السلام)، کەواتـە خـوا چاکتریـن پارێـزەرە، ئـەو لـە هەموو دڵسـۆزان دڵسـۆزترە.

دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ،
هێشتا برینی یوسف(عليه السلام) سارێژنەبووە و
لەیادی نەچووە!

گەرچی ژیانمان نارەحەتبوو،
گەرچی هێشتا برینەکانمان سارێژنەبووبوو،
هێندە بەسە،
کە خودایەکمان هەیە لە هەمووان بەبەزەیی ترە!

کەعبی کوڕی ئەحبار دەفەرموێت:

ئەو دەمەی یەعقوب(عليه السلام) فەرمووی:

﴿فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ﴾

واتە: خوا چاکترین پارێزەرە...

خودا فەرمووی:

سوێند بە عیززەت و جەلالم، هەردووکیانت بۆ دەگەڕێنمەوە!

﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا﴾[63]

ئەو دەمەی بەرژەوەندیان هەبوو،
وتیان براکەمان!
ئەو دەمەی بەرژەوەندییەکە نەما،
وتیان کوڕەکەت!:

﴿إِنَّ ٱبۡنَكَ سَرَقَ﴾[81]
زۆر کەس بەپێی بەرژەوەندی خۆیان،
شێوازی قسەکردنیان دەگۆڕن لەگەڵت.

﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ
وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ
وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ٦٧﴾

واتە: ئەی کوڕەکانم هەمووتان لە دەرگایەکەوە مەچنە ژوورەوە، بەڵکوو لەچەند دەرگایەکی جیا جیاوە بچنە ژورەوە، من هیچ سوودتان پێ ناگەیەنم لە بەرانبەر پێشهاتی خوادا، هەموو حوکم و بڕیارێك تەنها بۆ خوایە، پشت هەر بەو دەبەستم و خۆسپێرانیش با خۆیان هەر بەو بسپێرن.

خۆپاراستن لەچاو پێویستە،
بەبێ ویستی خوداش زیان ناگەیەنێت!

یوسفیان(عليه السلام) لێ سەند، ستەمیان لێی کرد،
لێ هێشتا منداڵەکانی خۆشدەویێت،
باوک خاوەنی دڵێکی گەورە و میهرەبانە.

﴿وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ
قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٦٩﴾

واتە: کاتێکیش کە چوونە ژوورەوە بۆ لای یوسف(عليه السلام)، یوسف(عليه السلام) براکەی بردە پەنای خۆیەوە و، وتی: بەڕاستی من براکەی تۆم، هیچ خەمگین مەبە بەوەی کە ئەوان دەیکەن لە گەڵت.

یوسف(عليه السلام) بە براکەی وت:

﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ﴾

واتە: بەڕاستی من براکەی تۆم، هیچ خەمگین مەبە!

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) بە یاری غاری وت:

﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾

واتە: خەمبار مەبە، خودامان لەگەڵە.

ئەو دەمەی مەریەم عیسای(عليه السلام) بوو، جبریل بانگی مەریەمی کرد:

﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي﴾

واتە: خەمبار مەبە!

لە ناوەڕاستی هەموو ناڕەحەتییەکدا،
خودا کەسێکت بۆ دەنێرێت هەتا ڕاوەستاو و ئارام بیت.

﴿قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ
وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ٧٧﴾

واتە: وتیان گەر بنیامین دزیبێتی، ئەوە بێگومان براکەیشی پێشتر دزی کردووە، بەڵام یوسف(ﷺ) پێناخۆشبوونی خۆی بەم تۆمەتە، لە دەروونی خۆیدا شاردەوە و دەری نەبڕی بۆ ئەوان، تەنها وتی ئێوە لەوان خراپترن، خوداش چاك دەزانێ بەوەی کە ئێوە دەیڵێن.

هەموو کاتێک ڕاشکاوی ستایشکراو نییە،
هەندێ جار بێدەنگی ستایشکراوە!
ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی نهێنییەکی شاردەوە،
یان سازشی لە مافی خۆی کرد،
بۆ ئەوەی دڵی براکانی ڕابگرێت و
ڕێگری لە بڵابوونەوەی خراپە بکات.

❖❖❖

چەندێ هەوڵبدەیت هەستەکانت بشاریتەوە،
هەڵویست و ڕەفتار و گوفتارت ئاشکرای دەکات.

❖❖❖

لە دایک و باوکی دایانبڕی،
هەڵیاندایە نێو بنی بیرەوە،
ناڵاندی بەدەست غوربەت و زیندانەوە،
بەڵام ئەو دەمەی بە دزی تۆمەتباریان کرد،
زۆر ئازاری چەشت،
هیچ شتێک هێندەی بوختان تاڵ و بە ئازار نییە.

ئەو وتەی ئازارت دەدات و
لە ناخی خۆتدا دەیهێڵیتەوە و کاردانەوەت نابێت،
نەمریت پێ دەبەخشێت،
یوسف(ﷺ) لە دەروونی خۆیدا شاردیەوە،
خودایش باسی چاکییەکانی لە قورئاندا تۆمارکرد و
هەتا ڕۆژی پەسڵان دەخوێنرێتەوە.

گەر دەتەوێت بە ئامانج و ویستەکانت بگەیت،
خۆت ڕابهێنە لەسەر ئەوەی،
جڵەوی نەفست بگریت و
خاوەنی پەرچەکردارەکانت بیت.

﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْۚ﴾
واتە: یوسف(عليه السلام) پێناخۆشبوونی خۆی بەم تۆمەتە، لە دەروونی خۆیدا شاردەوە و دەری نەبڕی بۆ ئەوان...

بەڵام فیرعەون وتی:

﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلْتَ﴾
واتە: ئەو کردەوە خراپەشت کرد، کە کردت (قیبتییەکت کوشت)!

ئەمەیە جیاوازی نێوان کەسە مەزن و بچووکەکان.

﴿قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا
فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٧٨﴾

وتیان ئەی عەزیز، بەڕاستی ئەو باوکێکی زۆر پیری بەتەمەنی هەیە، جا یەکێک لە ئێمە لەجیاتی ئەو بگرە، بەڕاستی ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین.

لەو دەمەی لە زینداندابوو، پێیان وت:

﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾

ئەو دەمەی عەزیزی میسربوو، پێیان وت:

﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾

کەسە باشەکان، دۆخەکان نایانگۆڕێت.

﴿إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَـٰعَنَا عِندَهُۥٓ ٧٩﴾

نەیفەرموو: ئیللا ئەوەی دزی کردووە!
چونکە یوسف(ﷺ) دەزانێت براکەی دزی نەکردووە.



## وێستگەی نۆیەم

# ڕۆحێک دەسووتێت

ئەو دەمەی ژیانت ڕەش دەبێت،
چاوەکانت سپی دەبن!

﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ ٨٣﴾

واتە: یەعقوب(ﷺ) وتی وانییە، بەڵکوو نەفسی خۆتان کارێکی بۆ جوان و ئاسان کردوون!

چۆن گورگ دەیخوات،
لە دەمێکدا لە داهاتوودا ئەستێرەکان سوجدەی بۆ دەبەن؟
متمانەت بە مژدەکانی پەروەردگارت بێت،
زیاتر لەوەی بە چاوەکانی خۆت دەیبینیت!

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ ٨٣

واتە: بۆیە چارم دان بەخۆدا گرتنە بەجوانی، بەو ئومێدەی خوا هەموویانم بۆ بهێنێتەوە، بەڕاستی هەر ئەو زانای کار دروستە.

ئەو دەمەی ناڕەحەتییەکان لەسەرت قورس دەبن،
پێویستە گومانی باش بە خودا ببەیت،
هیوا و گەشبینیت زیاتر بێت.
ئەو دەمەی یەعقوب زۆر ناڕەحەتبوو، فەرمووی:

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ﴾
خودا لە داواکەی زیاتری پێ بەخشی.
هیوای ئەوەبوو دوو کوڕەکەی بگەڕێتەوە بۆ لای،
بۆ ئەوەی لە کەنعان پێکەوە بژین،
یوسفی(عليه السلام) بۆ گەڕایەوە لەو دەمەی عەزیزی میسر بوو.

بۆ هەموو پێویستییەکانت،
بۆ هەموو خەونەکانت،
بۆ هەموو ئەو شتانەی چاوەڕێیان دەکەیت،
بەتەواوی متمانە و گومانی باشەوە بڵێ:

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ﴾

بەو ئومێدەی خودا هەموویانم بۆ بهێنێت!

کەسی گەشبین بەڵا و ناڕەحەتییەکان،
تەنها گەشبینییەکەی زیاد دەکەن.
یەعقوب(عليه السلام) کوڕێکی تریشی لەدەستدا،
بەڵام وتی: کێشە نییە، پێکەوە دێنەوە.
نائومێد مەبە،
لەوەیە لەیەک ڕۆژدا،
خودا بتگەیەنێت بە هەموو خەونەکانت!

﴿وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ٨٤﴾

واتـە: ئەوسـا ڕووی لـەوان وەرگێـڕا و گوتـی: ئـەی داخـم بـۆ یوسـف(عليه السلام)، هـەردوو چـاوی سـپی و کوێربـوون لـە داخ و خەفەتـدا، چونکـە هـەر داخ و خەفەتـی خـۆی دەخـواردەوە.

تەنها یەک خەم،
بەسە بۆ ئەوەی هەموو خەمەکانی ڕابردووت بێنێتەوە یاد!

۞۞۞

هەندێ شوێن،
تەنها یەک کەس پڕی دەکاتەوە!

۞۞۞

هەندێ  خەم و ئازار،
وشەکان دەستەوستانن لەوەی گوزارشتی لێ بکەن.

۞۞۞

پیاو بەلایەوە سەختە خەڵکی ئەسرینەکانی ببینن،
ڕووی لێ وەرگێڕان،
بۆ ئەوەی ئەسرینە پاکەکەی نەبینن.

۞۞۞

دوور مەبە لە دایک و باوکت،
کەس جێگای تۆ پڕناکاتەوە.
یانزە منداڵ، یوسفی(ﷺ) لەبیرنەبردبۆوە!
ئەو شتەی دایک و باوک زۆردڵخۆش دەکات،
ئامادەبوونی تۆیە.

۞۞۞

چاوەکانی سپی بووبوون لە خەفەتدا،
چاوەکانی یەعقوب(ﷺ)، نەک یوسف(ﷺ)!
ئێستا جیاوازییەکەت زانی؟!
هیچ خەم و دابڕانێک،
هێندەی دابڕانی منداڵ لە باوکی سەخت نییە.

۞۞۞

یەعقوب(ﷺ) بە کۆمەڵێک خەفەت و نارەحەتیدا تێپەڕی،
بەڵام چیرۆکەکەی بوو بە ئەشکەوتێک،
هەموو کەسێکی خەمبار پەنای بۆ دەبات!
با چیرۆکی تۆیش لەگەڵ خەم و ئازارەکاندا بەوشێوەیەبێت.

۞۞۞

﴿وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾

واتە: ئەوسا چووە کەنارێکەوە و بەدەم هەناسەی سارد و ئەسرینەوە وتی: ئەی داخم بۆ یوسفی نازدار، لە دڵم دەرناچێت یوسفی جوان خاس و خواناسم.

تەنها خودا ئەندازەی خەمەکانت دەزانێت،
تەنها خودا دەزانێت چەندێ ماندووی،
چەندێ شکاویت!
هەموو ئەوانە جەم بکە و
لەبەردەم پەروەردگارتدا دایانبنێ.
تەنها ئەو زاتە دەتوانێت خەمەکانت نەهێڵێت،
دڵت سارێژ بکات و
بە ئازیزانت شادت بکاتەوە.

۞۞۞

﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ﴾

چاوەکانی یەعقوب(عليه السلام) سپی بوون لە خەفەتدا و کوێربوون.
ئەو دەمەی ژیانت ڕەش دەبێت،
چاوەکانت سپی دەبن!

۞۞۞

﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ
حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ٨٥﴾

واتە: وتیان: سوێند بە خوا تۆ هەر واز ناهێنیت، تا وات لێ دێت پەکت دەکەوێت، یاخود لە تیاچووان دەبیت.

دژایەتیان کرد لە خۆش ویستنی یوسفدا(ﷺ)،
ئێستایش لە یادکردنەوەی یوسفدا(ﷺ) دژایەتی دەکەن!

وجوودی بەرەکەت بوو،
ڕۆیشتنی خەم و حەسرەت بوو.
لەدەستدانی شتە بەنرخەکان،
تەنها خاوەنەکەی هەست بە تاڵییەکەیان دەکات.



## وێستگەی دەیەم

# متمانەبوون بە خودا

بڵاوکردنەوەی ئارامی لە دەروونەکاندا،
لە ساتی نارەحەتی و دوودڵیدا، کاری پێغەمبەرانە.

﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ
وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨٦﴾

واتـە: یەعقـوب(عليه السلام) وتـی: مـن باسـی خەفـەت و پـەژارەم هـەر لای خـوا دەکـەم، مـن لـە لایـەن خـواوە شـتانێك دەزانـم کـە ئێـوە نایزانـن.

لەدوای ئەوەی خەم و پەژارەی خۆی بردە لای خودا،
لەدوای چەند ڕۆژێک بۆنی یوسفی(عليه السلام) کرد.
کەسە مەزنەکانیش سکاڵادەکەن،
بەڵام بۆ لای کێ...

ئەو خەمەی تەنها خۆت هەست بە گەورەییەکەی دەکەیت،
تەنها شایستەی ئەوەیە بۆ خودای باس بکەیت.

هەموو ئەوانەی باسی خەمەکانمانیان بۆ دەکەین،
هێز و توانا و دڵدانەواییان هەر چۆنێک بێت،
حەقیقەتی ئەوە نازانن کە هەستی پێ دەکەین،
ئەوە تەنها خودایە بەتەواوی ئاگای لە حاڵمانە.

گەر دەتوانیت،
سکاڵای خەمەکانت تەنها لەلای خودا بکەیت،
ئەنجامی بدە!

۞۞۞

ئەو کەسەی چێژی سکاڵاکردن لەلای خودا بچێژێت،
هەرگیز لەلای خەڵکی سکاڵاناکات.

۞۞۞

سکاڵابردنە لای خودا دژی ئارامگرتن نییە،
بەڵکوو ئەوەی دژییەتی،
سکاڵاکردنە لای بەندەکانی.

۞۞۞

لە قورئاندا دووجار باسی سکاڵا هاتووە:
یەکەم لە سوورەتی یوسف:

﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

دووەم لە سوورەتی موجادەلەدا:

﴿وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾(١)

بنوارە،
سکاڵاکانت بۆ کوێ بەرزدەکەیتەوە!

۞۞۞

یەعقوب(عليه السلام) لە سوجدەدا دەیفەرموو:
پەروەردگارا ڕەحم بە لاوازییەکەم ناکەیت،
ڕەحم بە پیرییەکەم ناکەیت،
ڕەحم بە مووە سپییەکانم ناکەیت و
ڕەحم بە ملکەچییەکەم ناکەیت.
خـودا فەرمووی:
«سوێند بە هێز و توانام، ئەگەر یوسف(عليه السلام) مردوویش بووایە بۆم زیندوو دەکردیتەوە، ڕۆژی دواتر مژدەی گەڕانەوەی یوسفی(عليه السلام) پێ گەیشت».

لە ئایەتی:

﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

وشـەی (أشـكوا) ئەلیـف لـەدوای واوە هاتـووە، لـە دەمێکـدا ڕێسـاکان ڕێگەنـادەن بـە نووسـینی ئەلیـف لێـرەدا، موفەسـیرەکان ڕاقەیەکـی نازداریـان کـردووە و وتوویانـە: سـکاڵاکەی هێنـدە گـەورە بـووە، سـەری کێشـاوە بـۆ ئـەوەی لـە وشـەکە زیـاد بکرێـت!

سوپاس یەعقوب(عليه السلام)، لە چیرۆکی تۆوە فێربووم،
داواکردن لە غەیری خودا سەرشۆڕییە.
سکاڵا بردن بۆ غەیری خودا لە دەرگادانە بە هەڵە.
پشت بەستن بە مرۆڤەکان هۆکاری بێهیواییە.
ئەوەی خودا بباتەوە هەموو شتێکی بردۆتەوە،
گەرچی هەموو خەڵکی دۆڕاندبێت.
ئەوەی خودای لەدەستدابێت هەموو شتێکی لەدەستداوە،
گەرچی هەموو خەڵکی بردبێتەوە.

ئەو دەمەی دەرگاگان داخران و دڵ گەیشتە قورقوڕاگە،
فەرمووت:

﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

واتە: باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم.

ئەدهەم شەرقاوی

۞۞۞

﴿يَا بَنِيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ ۖ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾

واتە: کوڕەکانم، بچنەوە بەڵکوو سۆراغێکی یوسف(عليه السلام) و براکەی بکەن، لە بەزەیی خوایش نائومێد مەبن، ئەوانەی خوانەناسن لە بەزەیی خودا نائومێدن.

ئەمەیە گومانی باش بردن بە خودا،
ماوەیەکی زۆرە کوڕەکەی لەدەستداوە،
ئەوا براکەیشی چۆتە پاڵی،
لێ هێشتا هیوایەکی زۆری بە خودا هەیە.

۞۞۞

بینایی لەدەستداوە،
چۆتە ساڵەوە،
دوو کوڕی لەدەستداوە،
هێشتا لاوەکان فێری گەشبینی دەکات.
نائومێدی لە دڵێکدا جێی نابێتەوە،
کە وابەستەبووە بە پەروەردگارییەوە.

﴿وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ﴾
واتە: لە بەزەیی خوایش نائومێد مەبن

۞۞۞

یەعقوب(عليه السلام) سێ شتی لەدەستدا،
یوسف(عليه السلام) و بنیامین و بینابیەکەی!
خودای گەورە هەرسێکی بۆ گەڕاندەوە،
بەهۆی تەوەکول و گەشبینی و خۆڕاگرییەکەی.

۞۞۞

بونیادنانی ئەرێنی و زیندووکردنەوەی گەشبینی لەوانی تردا،
خەسڵەتی کەسە مەزن و مەردەکانە.

۞۞۞

﴿وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ﴾
واتە: لە سۆز و میهرەبانی خودا نائومێد مەبن.

خەمەکانت، بە بڵاوکردنەوەی گەشبینی چارە بکە.
یەعقوب(عليه السلام) زۆر خەمبار بوو،
لێ هەر متمانەی بە خودای خۆی هەبوو،
باسی بەهیوابوون و متمانەبوونی بە خودا دەکردا!

۞۞۞

خودا دەفەرموێت: ﴿لَا تَقْنَطُواْ﴾
نائومێد مەبن.

یوسف(عليه السلام) بە براکەی وت: ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ﴾
خەمگین مەبە.

شوعەیب(عليه السلام) بە مووسای(عليه السلام) گوت: ﴿لَا تَخَفْ﴾
مەترسە.

یەعقوب(عليه السلام) بە کوڕەکانی وت: ﴿وَلَا تَيْأَسُوا﴾
نائومێد مەبن.

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) بە ئەبوبەکری(رضي الله عنه) وت: ﴿لَا تَحْزَنْ﴾
خەمبارمەبە.

بڵاوکردنەوەی ئارامی لە دەروونەکاندا،
لە ساتی نارەحەتی و دوودڵیدا،
کاری پێغەمبەرانە.

یەعقوب(عليه السلام)، یوسف(عليه السلام) و براکەی لەدەستدابوو،
بەڵام هێشتا ئەو مژدەی دەدا بە کوڕەکانی و
ڕۆحی گەشبینی تێدا زیندوو دەکردنەوە!
دەیفەرموو:

﴿وَلَا تَيْأَسُوا﴾

نائومێد مەبن...

یوسف(عليه السلام) لەگەڵ هەموو ئەو ستەمەی لێی کرابوو،
توانی دڵنەوایی براکەی بکات و ئارامی بکاتەوە!
فەرمووی:

﴿فَلَا تَبْتَئِسْ﴾

خەفەت مەخۆ و خەمت نەبێت!

دەتوانین هۆکاری دڵخۆشیی و ئارامی کەسانی تر بین،
ئازاری خۆمان هەر چۆنێک بێت!
ئەمە هێزێکە بەخشراوە بە کەسانێکی کەم،
تۆ لەوانە بە و بەخیلی تێدا مەکە!

بنواڕە خودا چۆن چاودێری یوسف(عليه السلام) دەکات:

عەزیزی میسر پێشوازی لێدەکات و بە ژنەکەی دەڵێت:

﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ﴾

واتە: ڕێزی لێ بنێ.

شای میسر پێشوازی لێدەکات و دەڵێت:

﴿إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾

واتە: ئیمڕۆ لەلای ئێمە خاوەن پلە و جێگەی متمانەیت.

براکانی پێی دەڵێن:

﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ﴾

واتە: خێرمان پێ بکە!

ئەو دەمەی بەندە ئارامگرییەکی جوان ئارام دەگرێت،
خودا دڵی سارێژ دەکات و بەسەر نەیارەکانیدا سەری دەخات.

﴿قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ٨٩﴾

واتــە: یوســف(عليه السلام) وتــی: ئایــا زانیتــان و لــە بیرتانــە چیتــان بــە یوســف(عليه السلام) و بــە براکــەی کــرد، کاتێــك ئێــوە نەفــام بــوون و ترســی خواتــان لــە دڵــدا نەبــوو؟

کەسی بەڕێز و مەرد،
سەرکۆنەی ئازیزانی ناکات،
بەڵکوو پۆزشیان بۆ دەهێنێتەوە.
نەیوت کارەکەتان بەهۆی ڕق و حەسودییەوەبوو،
بەڵکوو فەرمووی: ئەو دەمەی نەفامبوون.

﴿قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَاْ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ ٩٠﴾

وتیان: ئا تخوا بەڕاستتە! یوسف خۆتی؟
پێیانی وت: من یوسفم و ئەمەیش برامە.

نەیوت عەزیزی میسرم،
تەنها ناوی خۆی وت،
هیچ سیفەتێکی نەدایە پاڵ خۆی.
کەسی مەزن هەر بە مەزنی دەمێنێتەوە و
پلە و دەسەڵات بوغرای ناکات.

﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٠﴾

واتە: بەڕاستی هەرکەس خۆی بپارێزێ و دان بەخۆیدا بگرێت،
ئەوسا بەڕاستی خوا پاداشتی ئاکارپەسەند ون ناکات.

هەموو ئەو شتانەی لە سوورەتی یوسفدا هاتوون،
لەم دە وشەدا پوخت کراوە.

بە خۆڕاگری و تەقوا،
عیززەتی دونیا و قیامەت بەدەست دەهێنیت.

﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾

واتە: وتیان بە یوسف(ﷺ): سوێند بە خوا بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژارد بەسەر ئێمەدا، بەڕاستی ئێمە لە خەتاکاران بووین.

هەندێ کەس،
پێویستیان بە چەندین ساڵ هەیە،
هەتا قەناعەت بە شتێکی بەڵگەنەویست بکەن.

ئێستا تێگەیشتن تەنها لەلای باوکیان خۆشەویستر نییە،
بەڵکوو لەلای خوداش، لە هەموویان خۆشەویسترە!

﴿قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٩٢﴾

واتە: یوسف(ﷺ) وتی ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشت و تەشەرێکتان لەسەر نییە لەلایەن منەوە، خوا لێتان خۆش بێت، خوا لە هەموو بەسۆزان بەسۆزترە.

هەر کەسێک بە پەشیمانییەوە هاتە لات،
زۆر سەرزەنشتی مەکە،
چونکە پەشیمانی بەشی خۆی سزا و شکانی هەیە!

ئەوانەی خاوەنی دڵێکی سپین،
کێشەکانی بە:

﴿لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ﴾

چارەسەر دەکەن و
پەڕاوی ڕابردوو هەڵنادەنەوە.
کەسە مەزنەکان لەیەک ساتدا هەموو هەڵەکان لەیاد دەکەن!

کەمێک ڕاوەستە،
بزانە کێ هەڵەی بەرانبەرت کردووە ،
کێ دژایەتی کردوویت، کێ ستەمی لێکردوویت،
دواتر دڵت بە ئاوی لێخۆشبوون بشۆ و یوسف(ﷺ) ئاسا بڵێ:

﴿لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾

هیچ سەرزەنشت و تەشەرێکتان لەسەر نییە لەلایەن منەوە،
خوا لێتان خۆش بێت، خوا لە هەموو بەسۆزان بەسۆزترە.

ئەو دەمەی لای عەزیزی میسر بوو دەیتوانی تاوانەکە بکات،
بەڵام فەرمووی:

﴿مَعَاذَ ٱللَّهِۖ﴾

واتە: پەنا دەگرم بە خودا!
لەو دەمەی عەزیزی میسر بوو، دەیتوانی تۆڵە لە براکانی بکاتەوە،
بەڵام فەرمووی:

﴿يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ﴾

واتە: خوا لێتان خۆشبێت!
هەندێ جار بەها و ڕێزمان لەو شتانەدایە کە ئەنجامیان نادەین!



# وێستگەی یانزە

## بۆنی یوسفم(عليه السلام) بۆ دێت

ئەوەی ئیمڕۆ ئازارت دەدات،
لەوەیە سبەینێ هۆکاری دڵخۆشبوونت بێت!

﴿قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾
قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ﴿٩٥﴾﴾

واتە: باوکیان وتی بەڕاستی من بۆنی یوسف(عليه السلام) هەست پێ دەکەم، ئەگەر بە خەڵەفاو و بێعەقڵم دانەنێن. وتیان سوێند بە خوا تۆ هەر لەسەر هەڵە کۆنەکەی خۆتی.

وتی: بۆنی یوسف(عليه السلام) دەکەم!
وتیان: لەسەر هەڵە کۆنەکەی خۆتیت.
گوزارشتی لە هەست و تامەزرۆیی ناخی کرد،
ئەوانیش بە ناشرینی وەڵامیان دایەوە.
ئەو دەمەی ئازیزانت گوزارشت لە شتێکی ناخیان دەکەن،
هاوخەم و هاوسۆزیان بە،
پێویست ناکات ببیتە دادوەر بەسەریانەوە.

مادەم گومانی باشت هەیە بە خودا و
نائومێد نەبوویت لە ڕەحمەتەکەی،
بێگومان بۆنی ئاوات و خەونەکانت دەکەیت، پێش ئەوەی بگەنە لات.
دەروولێکردنەوە بۆنێکی هەیە،
تەنها گەشبینەکان بۆنی دەکەن.

۞۞۞

هەموو شتێک دژت دەوەستێتەوە،
بەڵام خودا هەر لەگەڵت دەمێنێتەوە،
لەگەڵ خودابە،
هەمووشتێک لەگەڵت دەبێت.

۞۞۞

ئازاردانی باوکە، پێی بڵێیت:
تۆ نازانیت، تۆ تێناگەیت، تۆ هەڵەیت.

۞۞۞

یوسف(ﷺ) کراسی هەڵبژارد،
بۆ ئەوەی لەو شوێنەوە دڵخۆشی بکات کە خەمیان پێ دا.

۞۞۞

سوپاس یەعقوب، لە چیرۆکی تۆوە فێربووم:
خۆشەویستی بۆنێکی هەیە دڵی خۆشەویستەکان بۆنی دەکات پێش لوتیان، کە وتت بۆنی یوسف(ﷺ) دەکەم، وتیان هەر لەسەر نەزانینە کۆنەکەتیت، کێ هەیە ڕقاوییەکان قایل بکات بەوەی دڵەکان بۆن دەکەن و بۆنی خۆشەویستەکەیان لێ هەڵە نابێت؟

ئەدهەم شەرقاوی

۞۞۞

یەکێک لە نەریتە کۆنە خراپەکانی مرۆڤ ئەوەیە،
هەر وتەیەکی نامۆ لە بەساڵاچووەکانەوە دەرکەوێت،
چواردەوورەکەی وەها لێکی دەدەنەوە،
کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خەڵەفاوی.

۞۞۞

﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٩٦﴾

واتە: جا کاتێک مژدە دەرەکە هات، ئەو کراسەی دا بەسەر دەم و چاویدا، یەکسەر بینایی گەڕایەوە، یەعقوب(عليه السلام) وتی: من بە ئێوەم نەوت؟ دڵنیا بن من لەلایەن خواوە شتانێك دەزانم ئێوە نایزانن.

ئەو کەسەی وەک مژدەدەر کراسەکەی هێنا،
یەکێک بوو لەوانەی کراسە خوێناویەکەی هێنا.
بە خۆڕاگری و لێبوردەیی،
ئەو کەسەی ڕۆژێک خەمباری کردوویت،
دەبێتە مژدەبەخشت.

۞۞۞

لە سوورەتی یوسفدا سێ جار باسی (کراس) کراوە:
لە یەکەمدا هۆکاری خەفەتە،
لە دووەمدا بەڵگەی پاکێتییە و
لە سێیەمیشدا مژدەی دڵخۆشییە.

ئەوەی ئیمڕۆ ئازارت دەدات،
لەوەیە سبەینێ هۆکاری دڵخۆشبوونت بێت!

۞۞۞

﴿قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾
قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾﴾

واتە: وتیان ئەی بابە لای پەروەردگار داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانمان بۆ بکە، بەڕاستی ئێمە گوناهبار بووین. یەعقوب(عليه السلام) پێی وتن: دواتر لە پەروەردگارم داوای لێبووردنتان بۆ دەکەم، بەڕاستی هەر ئەو لێبووردەی میهرەبانە.

﴿سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ﴾

فەرمووی: دواتر...
وەک ئەوەی کاتێکی تایبەت بە خۆی هەبێت!
دەبێت بڕوادار کاتێکی دیاریکراوی هەبێت،
هەست بکات خودا داوای لێخۆشبوون و نزاکانی گیرا دەکات.
دەوترێت دوای خست بۆ کاتی پارشێو،
چونکە کاتی نزاکردنە.

ئەو کەسەی نزای بۆ دەکەیت،
یان نزات بۆ کردووە!
پێی بڵێ کە نزات بۆ کردووە یان، نزای بۆ دەکەیت،
چونکە ئەمە کاریگەرییەکی باشی لەسەر دەروونی دەبێت!



# وێستگەی کۆتایی

## بەدیهاتنی خەونەکان

ئەی شادمانی یەعقوب(﵇) بە یوسف(﵇)،
ساتێک بەڵای مندا تێپەڕە!

﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ
رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ١٠٠﴾

واتــه: بــاوك و دایكــی لەســەر تەختــی حوكمڕانــی خــۆی دانــان، هەمــوو كەوتــن بــەڕوودا بــۆی بــە ســوژدە بردنــەوە، یوســف(عليه السلام) وتــی: ئــەی باوكــی خۆشەویســتم ئەمــە لێكدانــەوەی خەوەكــەم بــوو، كــە لەمەوپێــش بینیــم، بێگومــان پــەروەردگارم بەڕاســتی گێــڕا.

تەواو متمانەت هەبێت و
خاترجەم بە،
ڕۆژێک دێت خەونەکانت دێنە دی،
تەنها گومانی باشت بە خودا هەبێت.

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُۚ ١٠٠﴾

واتە: پەروەردگارم بەسۆز و دڵاوایە بەرانبەر ئەوەی بیەوێت.

خودا بەرانبەر تاوانبارانیش بەسۆزە،
براکانی یوسفی(عليه السلام)لە کوشتن پاراست و
ژنەکەی عەزیزی میسریشی لە خراپە پاراست.

۞۞۞

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُۚ ١٠٠﴾

دووری لە باوکی، بەسۆزیی بوو!
فڕێدرایە نێو بنی بیرەوە، بەسۆزیی بوو!
فرۆشتنی بە چەند درهەمێکی کەم، بەسۆزیی بوو!
زیندانیکردنەکەی، بەسۆزیی بوو!
هەموو ئەم تاقیکردنەوانە نەبووایە،
دەسەڵات و پایەداری بەدەست نەدەهێنا.

۞۞۞

﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ﴾

بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم کاتێ لە زیندان دەری هێنام...

نەیفەرموو لە بیرەکە دەریهێنام،
بۆ ئەوەی تاوانەکەیان بەیاد نەهێنێتەوە.

۞۞۞

﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ﴾
واتە: بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم.

پێشبینی بکە براکەت بۆت خراپ بێت،
نزیکەکانت توندبن بەرانبەرت،
ئازیزانت فەرمان بکەن بتکەنە زیندانەوە،
بەڵام ئەوەی نابێت پێشبینی بکەیت، ئەوەیە:
خودا خراپەت بەرانبەر بکات.

۞۞۞

﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ﴾

واتە: بەڕاستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم کە لە زیندان ڕزگاری کردم.

ساقیەکە لە زیندان دەرینەهێنا،
فەرمانی پاشا لە زیندان دەرینەهێنا،
دانپێدانانی زولەیخا لە زیندان دەرینەهێنا،
بەڵکوو ئەوە خودا بوو لە زیندان دەریهێنا و ڕزگاری کرد.

۞۞۞

گەر خودا گەیاندتی بە نیعمەتێک،
ساڵە سەختەکانت لەیاد نەچێت،
بۆ ئەوەی فەزڵی خودا بزانیت بەسەرتەوە.

۞۞۞

﴿وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَـٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَـٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ﴾

واتە: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەم بوو کە لەمەوپێش بینیم، پەروەرێنم ئاکامەکەی بەدیهێنا.

یاداشتە جوانەکان لەیاد مەکە،
گەرچی خەونێکیش بێت.
یاداشتە ناخۆشەکان لەیاد بکە،
گەرچی هەوڵی کوشتنیش بێت.

﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ١٠١﴾

واتە: ئەی خودانم، لەم وڵاتە دەسەڵاتت پێ داوم، فێرت کردووم چۆن خەون لێکبدەمەوە، ئەی دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی، هەر تۆی لە دنیا و قیامەت گەورەی منیت، بە موسوڵمانێتی بممرێنە و بمگەیەنە کاروانی پیاوچاکان.

چەندێ پێگەت بەرزبوو،
بیرت نەچێت فەزڵەکەی بگەڕێنیتەوە بۆ خودا،
بەبێ خودا، هیچ نیت!

ڕێگاکەی یوسف(عليه السلام)،
ڕێگایەکی دووردرێژ و پڕ ناڕەحەتی بوو.
ڕێگای پەیامبەران بەو شێوەیە!
نووح(عليه السلام) تێیـدا ماندوو بوو،
ئیبراهیم(عليه السلام) فڕێدرایە ئاگرەوە.
ئیسماعیل(عليه السلام) ڕاکشێنرا بۆ سەربڕین و
یەعقوب(عليه السلام) چەندین ساڵ کوڕەکەی لەدەستدا.
یوسف(عليه السلام) فڕێدرایە نێو بنی بیرەوە و
چەندین ساڵ لەزیندان مایەوە.
زەکەریا(عليه السلام) و یەحیا(عليه السلام) کوژران و
مووساش(عليه السلام) شاربەدەرکرا.
هێندەشی نەمابوو عیسا(عليه السلام) لەخاچ بدرێت،
موحەممەدیش(صلى الله عليه وسلم) جۆرەها ئازار و ناڕەحەتی چەشت،
ئەمەیە ڕێگای پێغەمبەران،
توێشووی باش بۆ ڕێگاکەت هەڵگرە!
چونکە نازانیت چی دێتە ڕێت و
نازانیت کۆتایی ڕێگا کوێیە،
لەبیرت بێت:

﴿إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾
واتە: دوارۆژ بۆ لەخواترسانە!

﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾

واتە: تۆ پشتیوان و یارمەتیدەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دواییدا.

ئەو دەمەی خەڵکی ستەمت لێ دەکەن،
خودا سەرت دەخات.
ئەو دەمەی خەڵکی بەدرۆت دەخەنەوە،
خودا پشتیوانیت دەکات.
ئەو دەمەی خەڵکی جێت دەهێڵن،
خودا دەمێنێتەوە و ئاگای لێت دەبێت.

۞۞۞

هەموو ئازیزانی لە دەووری جەم بوون،
لێ بانگی کردە ئەوزاتەی،
لە بیر و بەندایەتی و زینداندا پشتیوان و یارمەتیدەری بوو!

﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾

تۆ پشتیوان و یارمەتیدەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دواییدا.

۞۞۞

لە کاتی ناڕەحەتیدا:

﴿رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ﴾

لەکاتی خۆشیدا:

﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ﴾

بڕوانە پەنابردن بۆ خودا،

پشت بەستن پێی،

ئاتاج بوون پێی لە خۆشی و ناخۆشیدا.

پێویستە موسڵمان بەوشێوەیە بێت.

﴿تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾

پەروەردگارم، بە موسوڵمانێتی بممرێنە و بمگەیەنە کاروانی پیاوچاکان.

خودا،
سەروەت و جوان و پێغەمبەرایەتی بەخشیبوو بە یوسف(عليه السلام)،
بەڵام ئاواتی ئەوەبوو بە موسڵمانێتی بمرێت.
مردن لەسەر ئیسلام، ئاواتی پەیامبەرانە!

مەزنتر لە جوانی،
مەزنتر لە سەروەت و سامان،
مەزنتر لە دەسەڵات،
مەزنتر لە ئازادی،
ئەوەیە خودا بە موسڵمانێتی بتمرێنێت.

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِۗ ١١١﴾

واتە: لە سەرگوشتەی ئەمانە پەند هەیە بۆ ئاوەزان.

هەر کەسێک پەند لە چیرۆکەکانی قورئان وەرنەگرێت،
لە ئاوەزیدا گرفتێک هەیە.

۞۞۞

بێئاگا نەبوو لە یەعقوب(عليه السلام)،
بەڵکوو نەخشەسازی دەکرد بۆ ئەوەی یوسف(عليه السلام) ببێت بە پاشا.
ئەو دەمەی خودا یەکسەری وەڵامت ناداتەوە،
بۆ ئەوەیە جوانتر بۆت فەراهەم بهێنێت!

۞۞۞

ئەی شادومانی یەعقوب(عليه السلام) بە یوسف(عليه السلام)،
ساتێک بەلای منیشدا تێپەڕە!

۞۞۞

# سەرچاوەکان

- قورئانی پیرۆز.
- تەفسیری مامۆستا هەژار.
- تەفیسری ئاسان.
- تەفسیری پوختەی قورئان
- یوسفیات، عەلی جابر فەیفی.
- أنا يوسف، ئەیمەن عەتوم.
- إني لأجد ريح يوسف، خالید ئەبو شادی.
- نبأ يقين، ئەدهەم شەرقاوی.
- رسائل من القرآن، ئەدهەم شەرقاوی.
- ماڵپەڕی حەصاد، https://7a9ad.com/
- مكتبة النور، https://www.noor-book.com/
- چەندین سەرچاوەی تر.